پێشکەشە بە هاوژین ،ئەوی ژیانی تاڵکردم...

شێعری:هێمن مەلا کەریم بەرزنجی

دیوانە شێعری:دکتۆرای ئەوین

پیتچنین:ڕۆزا زەبیحی

نەخشەسازی ناوەوە:ڕۆزا زەبیحی

تیراژ:1000دانە

***چوارەم بەرهەمی کتێبی نووسەر***

سەرنج:لەڕاستیدا ئەم کتێبە هێشتاکە چاپنەکراوە ،بە هۆی سەرقاڵی و ، نەبوونی دەزگایەکی چاپەمەنی کە ئەرکی لە چاپدانی لە ئەستۆ بگرێت.بەو هیوایەی لە ئایندەیەکی نزیکدا چاپبکرێت.

# پێشەكی

**شیعر :هەڵڕشتی وشەیە بۆ خاڵی كردنەوەی ناخی شاعیر ...بەمانەیەكی تر ڕۆكردنی غەمە،پەژارەیە،خۆشی یە،كارەساتە وهەموو ئەمانەیە بۆ سەر لاپەڕەی دیوان و،بۆ نیگابینی خوێنەر...ئاخر ئەگەر ئەمانە نەبن لە ژیاندا شاعیر هیچ نابێت هەتاوەكو بیكاتە شیعر ، ئیدی شیعریش ناخوڵقیٚ بۆ خوێندنەوەی خوێنەر.**

**كەواتە شیعرو ژیان دووشتن كەلەیەك دابڕناكرێن و،بەمەش لەو قسەیەهەڵدێین كە شاعیر بەبوونەوەرێكی دیكە دەزانیٚ.**

**هەربۆیە هەموو ئەو وشانەی لای من بەشیعر دەكەونەوە ،وەك خۆی و،بیٚ دەستكاری ،بەڕەنگ و بۆی كاتی وتنی یەوە لەم چەند لاپەڕەیەدا خراوەتە ڕوو،كەمن بە دیوانە شێعری(دكتۆرای ئەوین)ناوزەدم كردووەو،خستومەتە بەردەست تۆی خوێنەر.**

**هێمن بەرزنجی**

**2004-4-16**

لەڕۆژی ڤالانتایندا..
چیمپێدەبەخشی گیانەکەم.
هێندەم نامەو ،عەترو،گوڵ و،کارت لەلایە..
ناتوانم ئەژماریان بکەم.
ئەم جەژنەیان ماچێکی پەمەیم دەوێ .
نەفەسێکی هێندە درێژ..
بۆنی ڕۆحتی تیا دەرکەوێ.
کچێ ، نەڵێی..!!؟
بەرلە جەژن پەیامێکت نەناردووە.
دار و بەردی سلێمانیش..
بەجوانی تۆسەرسام بووە.
منیش یەکێکم لەوانەی..
کەبەخاڵی گۆنای ئاڵت ئێجگار فریوم خواردووە.
هەرمنیش،نا..
کازمی هاوڕێشم دەڵێت:-
کەڕوخسارت لەمانگ دەچێت.
دیلمانیش لەبەر دڵی من..
هیچ شتێکی بۆ ناوترێت.
وەلێ،هەرێم ...
تۆی بەبوکەشوشەچوواند
منیش بەرلەڤالانتاین..
وینەی تۆم لێرەدا نەخشاند.
#کازم ،وهەرێم،و دیلمان:-سێ هاوکلاسی خۆشەویستمن
*ئەم شێعرە لەماڵپەری نوسەری کورد دا بلاۆکراوەتەوە.
*لەڕۆژی ڤالان تاین دا خوێندراوەتەوە لەکەناڵی کوردسات،2004ز
*لە ژمارە 4ی گۆڤاری گەنجیشدابلاۆ کراوەتەوە.

كەداواى ڕۆحى لێكردم منيش ماچم تەمەنناكرد
كەزانانم دڵى دەشكێ،دڵم نەشكاندو سەلماندم.
( موخليس )

1
لە دوواى تۆ كەسم خۆشناوێ
دڵ سەبوورى بەكەسنايە .
هەزار نەفرەت لەڕابووردوو
بريا تۆشم نەناسيايە.

2
كەڕۆيشتى بۆچ مالأوايت ليمنەكرد
هەتا لەچاوەڕوانيدا نەمێنمەوە.
ئەى ناترسى هێندە دووربى
لەدووريتا سەرنێمەوە.

3
كە ئەتزانى جێمدەهێڵى
بۆچى دڵى منت دووان؟!!
ئەى نازانى دوواى دابڕان ..
ژيان پڕدەبێ لەخەزان.

4
چيدى عەشق چارم ناكات
بڕۆ ئيدى مەمدوێنە.
با ( مەى ) ببێ بەهاوسەرم
توخوا!!ساقى جامێ بێنە.

* ئەم شێعرە بلأوكراوەتەوە لە :-

1/نوسەری کورد بەناونیشانی( تەنیای ) لە 2003/1/29

2\ لە گۆڤاری مەهاباد دا،کە لە ڕۆژهەلاتی کوردستان دەردەچێت.

3/لە ژمارە 72ی هەفتەنامەی ( ڕۆژیگەل )ی ڕێکەوتی 2002/01/26

لەکەنار دەریایی نامۆبووندا مەوەستە..
نەبادا نەهەنگی مەرگ قوتت بدا.

ڕووەو هەڵدێر سەفەرمەکە..
لەویٚ ، لەکەناری کونەبادا..
دۆزەخێك هەیە.
ڕۆژ بەڕۆژ کورەکەی جۆش دەدریٚ..
ئەی گوڵ ..
تۆبەرگەی باهۆزی پایزناگری..
تۆ بەدیتنی چەقۆی سوری جەلادەکان ..
فرمێسك بەچاوتادێتەخووار..
تۆلە پرسەی گیلاسە فلیقاوەکانی ..
ژێر پێی دیکتا تۆرەکاندا ..
دادەنیشتی..
تادڵنەوای گێلاسەساواکان بدەیتەوە..
نەبادابتۆقێن..
نەبادا گەورەنەبن و
بەگرگنی بمرن.
غەریبانەمەڕوانە..!!
من دەزانم کەباهۆزی قەدەر ..
چاوەڕەشەکانت وەك چاوی مەولەوی..
بەفرمێسکی مەرگی خاتو عەنبەر سوردەکەن.

غەریبانەمەڕوانە..!!
دەترسێم ئەم غەریبیەت مەرگبێ.
لەغەریبیت زۆر دەترسم..
دەترسم مەرگ مەودات نەدا..
لە پرسەی گەڵاهەڵوەریوەکانی"
ژێر درەختێکی بەهاردا
دابنیشیت.
غەریبانە مەوەستە..!!
لەغەریبیت  زۆر دەترسێم..!!
دەترسێم..
بەئاهەنگی مەرگی شەو ڕانەگەیت.
ئەی کێ سەرچۆپی بگرێت!!؟
سەرچۆپی ئاهەنگی مەرگ..!!
*لەگۆڤاری لڤین،ژ(9)ی ئەیلولی2003، و نوسەری کورد دا بلاْوکراوەتەوە.

لەو ڕۆژەوەی تۆم ناسیووە..
تائەوساتە خۆشم ویستووی.
من نازانم کچی مەسیح..!!؟
بۆچی هیچم لێنەبیستووی؟
کەچی ئەمڕۆ خاچێکی گەورەی مەسیحت..
بەسەر سنگتا هەڵواسیوە.
دڵنیابە بەر لەم کارەش..
وێنەی عیسام لەنێو چاوەکانتا دیووە.
بۆیە ،گوڵم_ هەرگیز نەڵێی:
تا ئەوکاتەی خاچی عیسام..
بەسەرسنگما هەڵنەواسی .
تۆنەتتوانی من بناسی..
چونکە ،کچێ..
هەرکە لەماڵ دێمە دەرێ.
ڕۆحی شەیدام مەسیحێکەو
بەبینینی چاوەکانت..
ڕۆژی سەدجار لەخاچ دەدرێ.
2004-1-21/20

نیگای چاوت مەگرە دڵم..
باڕۆحم پڕئازار نەبێ.
بادڵم لەچاوەڕوانی..
بێزار نەبێ.
تۆ بێوەفای ..
لەدورەوەلێمدەڕوانی.
دەوەرە پێش ..
نیگای چاوت دوورلەخەندە ..!!
خەمی هانی.
من وامزانی ..
شیلەی لێوتم پێدەبەخشی و
دەبمە ئیلیا*.
بۆیە هەروا..
بەسانای خۆشم ویستی ..
بەبێ پەروا.
دەنا، گوڵم تائەم ساتە ..
هیچ کچێکم بە مجۆرە خۆش نەویستووە.
سەیرم لێهات، کاتێك دیتم..
بزەی لێوت ، هەست و
هۆشمی بردووە.
تا ئەم ساتە لەنێو دڵدا ..
جێم بۆ کەس ڕانەخستووە.
ئیدی بۆچی دەڕۆی ، کچێ؟!!
ئەگەر دەشڕۆی ..
با سەفەرت بەشەو نەبێ.
نەبا ئاسمانی بەختی تۆش ..
وەك ئاسمانی بەختم ڕەشبێ.

**کوردستان – سلێمانی**

2003/9/3

***ئیلیا :- مەبەست( ئیلیای کوڕی مەلکان ) ە کەناسراوە بە ( خدری زیندە ) و،گوایە ئاوی حەیاتی خواردۆتەوە ،و بەمەش بۆ هەمیشە لەژیاندا دەبێت و،نامرێت.**

**لە 2003/9/7دا لەنوسەری کورد دا بڵاوکراوەتەوە،هەروەها لە مانگنامەی زەنگیشدا بڵاوکراوەتەوە.**

نازدارەکەم ..
ئەوکاتانەی کەتەنیای دەمدووێنیٚ.
ناچاردەبم پێنووسەکەم بگرمەدەست..
هەتاوەکو پرچی هۆنراوەم دابێنی.
جانازانم!!ئەوساتانەی کەتۆتەنیای..
چۆن مۆتەکەی نیگەرانی لەچاوانت دەتۆرێنی.
خۆناتوانی ببیتەمیوانی وشە..
چونکەوەکومن شاعیرنی.
بۆیەناچار دەستدەدەیتە ماسکارایەك..
چاوەکانتی پێڕەشدەکەی.
یان لەبەر ئاوێنەیی عیشقاڕادەوەستی و
خۆت جواندەکەی.
وەلیٚ، ئەفسوس ..
جارجار نایەی..
هەتاوەکو تەنیای من ڕەوێتەوە.
بەلاّم قەینا خۆتۆوەك من (ئەهلی بەسەر) نی ،گوڵەکەم
ئەگینا جارجار ئاوڕت لێدەدامەوە.

*ئەهلی بەسەر:- زاراوەیەکی تەسەوفە ،بەمانای چاوکراوە یە،خاوەن زەین بۆبینینی شتی ونو نادیارو هەستکردن بەشتەشاراوەکانی پشت پەردە.

*لە 20003/8/28دا لەماڵپەری نوسەری کورد دا بلاّوکراوەتەوە

فریوت دام بەنیگای چاوی ڕەشت..
ڕەشئەسمەرم..!!
ئێستا دەڵێی : من بڕوام بەئەوین نییە..
خودایە داد بۆکێ بەرم.
دڵم دایتێ هەتاوەکوهێلانەی خۆشەویستی خۆت..
لەنێویدا بنەخشێنی.
کەچی نەتهێشت گوڵی نۆ بەهاری ژینم سەردەربێنێ..
دەمرە نجێنی.
یانی: گوڵم دەمگریەنی.

ڕەشئەسمەرم..!!
خۆمن گوتم :-
بێلەتۆ ئارامناگرم.
گەر بێت و..
ڕۆژێ نەتبینم وەختە بمرم.

توخووا،کچێ..
مەڵێ من بۆ خوێندن هاتووم.
خۆمنیش وەك تۆ خوێند کارم.
بەلاّم بەمەکری نیگای تۆ..
گرفتارم.

مەکر: حیلە – فێڵ
ئەم شێعرە پێشکەشە بەشادە
،ئەو مرۆڤەیەیکە مجار گوتی ( بەعدە تەفاهوم،زەواج موباشیر ) چونکە باوەڕم بە عیشق نییە،کوڕان هەموودرۆزنن.

1
چۆنبیرت چوو..!!؟
خۆپێمَوتی :-
یەکەم نوێژی عاشقێتیم،
لەمیحرابی چاوەکانتا دابەستووە.
یەکەمین کۆشکی ئەوینم ..
لەنێو دڵتا هەڵبەستووە.
گراویەبێوەفاکە ،
وەرەو
تاوێ..
بەسۆزەوە تەماشاکە.
کەچۆن فرمێسکی چاوانم..
دڵم دەخوا.
کەچۆن رۆحم..
بۆدۆزینەوەی هەوارگەت گینگڵدەدا.

2
چۆنبیرت چوو..!!؟
کە پێمَوتی :-
لەورۆژەوەی ،
چاوەکانم لەتۆ راما.
خۆشم ویستی و
عاشقت بووم ..
بەبێ پەروا.

تۆپێت وتم :-

منیش هەروا.

2003/3/3

*گراوی :- یار_ دۆست

*لەژمارە 435ی 19یئاداری 2003ی هەفتەنامەی گوڵان ولەماڵپەری نوسەری کورد دابڵاوکراوەتەوە.

PDF 4 KURD

بۆ کوێ دەڕۆی ..؟!
دڵم بەدوای تۆداویێڵە .

فەینا بڕۆ..
بەڵام، لەگەڵ خۆتدا بمبەو
بەتەنیای جێم مەهێڵە.
ئەگەرنامبەی باسی سەفەرم لامەکە،
دڵەی شەیدام پەروانەیەو
لەنێو غەمانغرۆی مەکە.

فەینا بڕۆ..
ئا..ئا..بڕۆ
چونکە ئەوڕۆژانەت بیرکرد
پڕبوون لەماچ.
ئەو ئێوارەیەشت بیرچویەوە ..
کە پێتوتم :
نەکەی پەپوڵەی عەشقی من ..
بدەی لەخاچ.

بەلاَم لەوەدڵنیابە
بۆکوێ بڕۆی ..
دڵەی شەیدام بەدوواتدا دێ.
عاشقێکم هێندە سەرمەست،
مەگەر مەرگ نێوا نمان بێ.

نا..نا..مەڕۆ ..!!
نەبائیدی نەتبینمەوە.

نەبا لەچاوەڕوانیتدا ،
بۆئەبەدی سەرنێمەوە.

2

بۆ کوێ دەڕۆی..؟!!
بەم سەفەرەت ..
پەڕەی گوڵی خەونەکانم هەڵدەوەرێ.
بۆ کوێ دەڕۆی ..؟!!
دڵم بەرگەی ئازاری دووریت ناگرێ.
دوور لەچاوت ..
حەرفێ شیعرم بۆنانوسرێ.

2003/3/11ز

*لەمانگنامەی تیرۆژ دابلاوکراوەتەوە.
*لەماڵپەری نوسەری کورد دابلاوکراوەتەوە.

ئەو ئیوارەیەم لەیادە..
کە پێت وتم :-
ئاخر هێمن..
خۆ ئێمە قەت بەیەکناگەین..
ئیدی بۆچی بەنیگای چوم سەرخۆشی؟!؟؟
من هەڵەبووم..!!
من وامزانی ئەم قسەیەشت نازێکە و
پێمدەفرۆشی.
دەنا، کچێ قەتنەمدەهێشت..
لەباوەشی پڕلەسۆزما پێکی ئارامی بنۆشی.

*　　*　　*　　*

خۆ خۆتوتت :-
ئەوساتەنەی لەگەڵ تۆدام..
ڕۆحم نوقمی ئارامییە.
کەچی ڕۆشتی و ،فرمێسک و ،غەم ..
دووا دیاریمالئاواییە.

2004-1-¾
سلێمانی
10,30شەو
*لە نوسەری کورد دا بلاْوکراوەتەوە.

تا ئەو ساتەی‌تۆم نەناسی..
فرەشێتی  ماجستێرو
دکتۆرابووم.
کەچی گوڵم بەناسینت..
لەو حەزەشم تەوەلابووم.
وەلێ، قەینا..
لەنێو زانکۆی چاوەکانتادکتۆرای..
ئەوین ئەخوێنم.
گەر ئیمتیازیش نەهێنم"
دڵنیابە وازناهێنم.
چونکەگوڵم..
باشەی تۆوەك ئیمتیازە.
دکتۆرای ئەوین بێلیژنەو
بێسەرۆکەو
هەمووی ڕازە.
شادە – ڕەشتاڵەکەی دڵم..
ئەگەر ڕۆژێك بەکامێرای نیگایەکم.
وێنەیەکی جووانت نەگرم..
لەخۆم ونم.
چونکە گوڵم..
تۆ لێم ونی .
چۆن ون نەبم..
تۆبابەتی ماجستێرو
نامەی دکتۆراکەی منی.

2004-5 -23/22

*ئەم شێعرە لەماڵپەرەکانی ( نووسەریکورد،وکوردستان نێت ،ودەنگەکان )دا بلاّو کراوەتەوە.

*لەڕۆژنامەی (سۆڵیداریێتی خوێندکاران،و(نێوەند)دا بلاّوکراوەتەوە.

*لە ڕۆژنامەی (ئەکادیمۆس)دا بلاّوکراوەتەوە.

من وامزانی ..
ژمێریارێکی شارەزای..
هەموو وردە نیگاکانم ئەژمارەکەی.
کەچی چاوانت پێمدەڵێت:-
لەمن ناگەی.

* * * *

دەنا،کچێ..
کەدەتڕوانی..
چاوێکت لێدادەگرتم.
سوچێکی دڵت دەدا پێم..
بەسەرسامی ڕاتدەگرتم.

* * * *

ئاخر ،کچێ..
نیگاکانم ئاشکرایە..
داوای ئەوینت لێدەکەم.
لەنێو دلت جێمکەرەوە..
تا هەمیشە یادت بکەم.

شەوی14/15-12-2004
8,55دەقیقە
* لە نوسەری کورد دا بڵاوکراوەتەوە.

**ئەو ئێوارەی بۆینباخێکی سورم کڕی**
**هەستمکرد هێزێکی نادیار بەرەو مەسیح ڕامەکێشێ.**
**کەچی گوڵم هێندەی نەبرد..؟! ؟!**
**ئەوینی تۆ هاتە پێشێ.**
**شەوی** 11/12-1-2004

لەو ڕۆژەوەی ..

بەبەردەرکی ماڵەکەتاندا ڕابووردم.

لە پاش ئەوە، لەسەر ڕێگەی خوێندنگەدا ..

پێت گەیشتم.

خۆشم ویستیت..

خۆشت ویستم.

بە بزەی لێو..

بەهەستو

نازو

سۆزەوە ،خۆت ناساند پێم.

کەدەمبینی...

کەدەتبینم...

1

کەدەمبینی..

بەبزەوەلێممەڕوانە..

چونکەلیوم بزەدەگرێ.

کەدەمبینی..

بەڕقەوەلێممەڕوانە..

چونکە پە پوولەی ڕۆحدەفڕێ .

کەدەمبینی..

لەدورەوەخۆت مەنوێنە.

وەرە پێشێ و

دەمت بێنە.

با تێکەلاوی یەکتربین..

لەنێو یەکدا بتوێینەوە.

نەبا مەرگ مەودانەدا..

یەکتری ببینینەوە.

کەدەمبینی..

وەك هومایەك ..

لەسەر دڵم هەڵبنیشە.

دوور لەلێوت ..

دڵەی شەیدام پڕلەئێشە.

2

کەدەتبینم..

هیچ ئیشارەتت بۆناکەم.

تا ئەوکاتەی دێمە پێشێ و

خۆم ئاوێزانی تۆدەکەم.

تا ئەو کاتە ..

لەنێو تۆدا خۆم وندەکەم.

**2003/4/17**

* ئەشێعرە لە 2003/4/19دا لەماڵپەری کوردستان نێت دا بڵاوکراوەتەوە.

*هوما :-باڵندەیەکی بەفەڕو بەرەکەتە وەك باسکراوە.

دویٚ شەوزۆرزۆر پاڕامەوە..
لەباوکی خۆم.
تارێمبدا پەنجەکانم داگیرسێنم ..
لەجێی بیست مۆم.
بۆ ئاهەنگی لەدایکبوونت ، شادەی گوڵ
وەك دیارییەکی بچکۆڵە پێشکەشتکەم.
باوکم فەرموی:-
چۆندڵت دێپەنجەکانت داگیرسێنی..؟!!
هێنەعەشقی مرۆڤ مەبە..
گەردابڕێن هەرەس دێنی.
وتم:- باوکە لەبیرتدێکە پێتوتم:-
هیمنەکەم،مادام کوڕی ..
دڵنیابە ڕێگەت نادەم..
هەرگیز بووکەشوشەبکرێ.
ئەی باوکە گیان!!دەبێت ئێستا چیمپێبڵێی؟!!
کەدەبیستی عەشقی بووکەشوشەیەکی ڕەشئەسمەرم
کەدەبیستیڕۆژی سەدجار بەشادەی دڵبەرم دەڵێم:-
لەبۆتمرم.
باوکی ئازیز بەلوتفی خۆت مەرحەمەتکەو
لێمببورە.
ڕۆحی ماندووم بۆچاوانی ڕەشئەسمەرم قوڵپدەداو
ئەوینی من بێسنورە.
کەمنداڵ بوومرێگەتنەدام ،
جارێك بوکوشوشە بکرم.
گوایە کوڕم..
دەمگوت: قەینا ، ئەوەی تۆپێمی دەفەرموی..

لەسەر سەرمە.
وەلێ، ئێستا نەح و
سەرف و
بەلاغەو ،عیلمی تەریقەت چوار بنەمان وەكوناوی خۆم لەبەرمە.
ئیدی باوكەدەمەوێت ببمەباحیسی وشەی ( ئەوین )
تكا دەكەم ڕێگەم بدە ..
من و ( شادە ) بۆیەك بژین.

كوردستان- سلێمانی
2004/10/4
7:20دەقیقە

ئەوکاتەی دڵ..
لەکەناری تەنیایدا لەنگەر دەگرێ.
پەپوولەی ڕۆح ..
لەشەقەی باڵدەدەو
دەفڕێ.
ئەوکاتانەی خونچەی لێوی..
دوودڵداری تینوبۆیەك بەیەك دەگەن.
مەلاکان و
پیاوانی خێڵ ..
یەکدەنگ دەبن.. هاوار دەکەن.
ئەوکەسانەی ئاوادەکەن ..
بێشەرەفن ..
دەیانەوێ ئابڕوی خێڵ و
دین و
کوردەواری بەرن.
هەتا تۆزێ شەرەف ماوە ..
سەریان بڕن.

2003/7/30
لە 2003/9/1 لەماڵپەری نوسەری کوردا بلاۆکراوەتەوە

1

گلەیت لێبێت گوڵەکەم ..

بۆ نەهاتیت..!!؟

2

بڕوات هەبێت..

لەوساتەوەی چومە نێو هۆڵ ..

تائەو ساتەی ها تمەدەرێ.

مێشکم لای شوێنەکەی تۆبوو.

دەفتەرێك و

سەدرییەیەك لەجێی تۆبوو.

دڵی چەندین هاوڕێی ئازیز..

لەسەر چۆڵی شوێنەکەتۆ لێم زویربوو.

هەرکەس دەیگوت :- ( بادانیشم )

دەمگوت :- ببورە گیراوە.

شانۆ گەریکەش تەوی‌و بوو ..

بێئەوەی بزانم باسی چیکراوە.

3

گلەیت لێبێت گوڵەکەم ..

بۆ نەهاتیت..!!؟

4

کەڕۆشتمەوە ،بۆماڵەوە..

دایکم فەرمووی :- ( کوا سەدرییەکەت بۆتبشۆرم )

ئینجا وەبیرم کەوتەوەلە هۆڵەکەلێمجێماوە.

تەلەفۆنم بۆ بەڕێوەبەری هۆڵکردو وتم :-

( برا، تادواڕۆژی شانۆییەکە ئەو جێگەیە هەرگیراوە )
بۆیە گوڵم هەر ڕۆژێك چویت..
دەبینی دڵ و
سەدرییەو
دەفتەرێکی ئەنەتۆمی..
لەسەر کورسییەکی چۆڵی نێو هۆڵەکە بەبێنازی بەجێماوە.
تکادەکەم، ئەگەرچویتو
گەڕایتەوە، لانی کەمدڵم هەڵبگرەو
بیگێڕەوە بۆ شوێنی خۆی.
هەر دوێشەو بەماڵەوەم وت:-
( ئەگەر مردم بزانن هۆکارەکەی تۆی )

2004/4/2
هەینی
کوردستان – سلێمانی.
1:15دەقیقە

1

**جیاوازی نێوانی ئێرەو**

**هەندەران دەزانی..؟!!**

**لێرە مرۆڤ دەدرێ لەخاچ.**

**بەلاَم، لەوێ..**

**بەبزەوە دەدرێتەبەر دەستڕێژی ماچ.**

**لێرە حیزب بالاَدەستەو**

**لەوێ دەوڵەت.**

**لێرە ئەگەر مەسئولێك لە پشتت نەبێ..**

**مرۆڤێکی ئێجگار نەگبەت.**

**ئیدی بۆچی پێمان دەڵێن:- سەفەرمەکەن.**

**بۆچی دەڵێن :- نیشتیمانتان بەهەشتێکی بێوێنەیە..**

**کارمامزێ لێرەناژی ..**

**ئەوەی هەیە ، دڕندەیە.**

2

**کەمناڵبووم،**

**باوکم دەیگوت:- ( نیشتیمانتان لەجێی منە )**

**ئەوتانە هەبێ،منیشتان هەم.**

**کەچی ئێستا پیتەکانی( نون و یـاء و شینو تـاء و میم و ئەلف )**

**لای ئەو ونە .**

**نەك هەرلای ئەو ..**

**لای هەموو کەس نیشتیمان ناوێکی ژنە.**

**بەشی یەکەمی ئەم شێعرەلە 2002/9/6ز دانوسراوە وەلێ، بەشی دووەمی لە 2003/1/25زدانوسراوە کەلەهەمان بەرواردا 2003/1/25ز لەکوردستانئێت دا بلأوکراوەتەوە**

چۆن ئەورۆژەم بیرچێتەوە..!!
کە پێت وتم :-
توخوا !! هێمن..
خەفەت بۆسەفەرم مەخۆ..
ڕۆژێك دادێ..
کەدەستت بکەمەگەردن.
کە پێتوتم :-
هیچ شتێك مابەینمان نییە ..
مەگەر مردن.
ئێستا خۆم و
پێنووسەکەم..
ئەشکی خوێنین ،
بۆسەفەری تۆڕۆدەکەین.
زۆر دەترسێم هێندەدووربیت..
بەیەکنەگەین.

2

تووخوا !! کچێ..
سەفەر مەکە ..
دڵم بەرگەی ئازاری دووریت ناگرێ.
هێندەنابا ..
دڵم لەدووریتا دەمرێ.
جائەو کاتە تۆی سەبەبکار..
بۆ کوێ دەڕۆی..!!؟
لە هەرکوێبیت نزای عاشقان دەتگرێ.
جێممەهێڵە ..
دوورلەچاوەکانت تەنیام.

تەنیاتریش لەتەنیایی.
قەینا برۆ ..
مانای تەنیای نازانی.
3
هیچم نییە پێتببەخشم ..
بۆئەم کۆچە !!
لەناکاوەت ..
جگە لەفرمێسکی چاوم .
بۆ نازانی لەدوریتۆ ..؟!!
لەدەریای غەماخنکاوم.
چۆن نازانی ؟؟
کەتۆبڕۆی ..
ئیدی تەنیا دەبم..
تەنیا ،
مەگەر پێنوسەکەی دەستم..
بە پارچەیەك لەهۆنراوە ..
غەمی دڵم بەبابدا.
دەنا تەنیای زۆر سەختەو
بەساناى ڕاونانرێ.
کچێمنت لەبیرنەچێ..
خووا !!ئەتگرێ.
وەك چۆن ،کەمن..
هەرگیز تۆم بیر ناچێتەوە.
دەتوخووا تۆش..
جارجار منت بیربێتەوە.
کوردستان – سلێمانی
2003/9/10ز
*لە2003/10/1زلەنوسەری کورد دابلاوکراوەتەوە

## هەموو شتێك بەعەشق دەستپێدەكات
## ( هێلین سێكسۆس )

-1-

قەڵەمەكەمم گرتە دەست...

تابۆ چاوانت بێتە گۆ.

وەلێ، ئەفسوس...

وڕكی گرت و...

هیچ وشەی نەنووسی بۆتۆ.

–2–

هەستمدەكرد ...

گیان و...

جەستەم،

شەكەتی چاوەڕوانییە.

بیرت نەچێ...!!

چاوەڕوانی تاسەرنابێ‌و

سەرئەنجام ماڵئاواییە.

–3–

من وامزانی...

هاوژین_میت..

بۆیەمیگام ئاوێزانی بالآت دەكرد.

بەلآم ، گیانە...

من نەمزانی بەناسینت...

وشەی(ئەوین) لەدەرونماوەفاتی كرد.

–4–

هاوژینەكەم...

من وامزانی...

لەو ڕۆژەوەی چاوەكانتم خۆشویستووە.

خەونەکانم...

حەزو،

حۆزگەم...سەوزبووە.

قەینا گیانە...

گەربێوەفایشبنوێنی دڵەی شەیدام...

لێت خۆشبووە.

چونکە حەرفی شێعرەکانم...

لە سیمای تۆ وەرگرتووە.

-5-

تائەو کاتەی تۆم نەناسی...

نەمدەزانی شیعرچیەیە.

تائەوکاتەی تۆم نەناسی

نەمدەزانی چیرۆك چیەیە.

تۆپێت وتم:

شێعرو ...

چیرۆك،

سەرچاوەکەی دڵدارییە.

*نووسەری کورد2003

ئەمشەویش وەکشەوانیدی..
خەو لەچاوەکانم زرا.
هێندەم ئەستێرەکان بژارد ..
ئاسمان ئەستێرەی لێبڕا.
هەرهەموویم هۆنییەوە..
وەلێ ، ئەمما .نەدەزانی ئەم ملوانکەیە بەم بەکێ..؟؟
هەتاوەك بۆ یاری ببا.
کەسێنەبوو ..
فریاد ڕەسێ ..
تالەم غەمە نجاتم با.
وەلێ ،قەینا .
غەم بەدڵی من ناوێرێ..
بۆ یەکەم جار ..؟؟
غەم لەدڵی منا ڕووا.

20003/5/31

*لە ماڵپەری نوسەری کورد دا بلاوکراوەتەوە.

1

ئەمشەو جەژنی سەری ساڵەو

هاوڕێکانم لەدەوری شەجەرەمیلاد*کۆدەبنەوە.

منی ئاشوفتەحاڵی عیشق ..

لەدوری شارای دڵبەرم هۆن هۆن فرمێسك دەهۆنمەوە.

هرخۆم تەنیا ..بەڵێ تەنیا..!!

لەسوچێکی ژوورەکەمدا ،دەگەڵ فرمێسك ژواندەکەم.

هەتاوەکو یادگارییەکانی ڕابووردووم تێبپەڕێ و

یادیان نەکەم.

دەچمە کونجێك کەهیچ شتێکی لێنەبێ ،جگە خۆم و

بالێفەکەم.

تانانەت مۆمێکیش نابەم ..

نەبادا ،ئەوساتانەم بێتەوەیاد..

دەبوومە پەروان بۆتۆ ،هۆ_شـــــارا_کەم.

ئەی شەمعەکەم..

پاش تێپەڕبوونی نیوەی شەو ..

هاوڕێکانم لەئاهەنگ دەگەڕێنەوە.

بەدەستێك تۆزی سەر شان و

بەدەستێك جێماچی یاریان دەسڕنەوە.

2

بۆیە ئەمشەو ، بەڵێ ئەمشەو..!!

غەمەکانم دەنوسمەوە بەچەند دێڕێ.

هەروەکو چۆن ژین و

شێعرم،هەردەم غەمیانلێدەچۆڕێ.

حەسرەتو

غەم هێندە زۆرەتەواو نابێ.

وەلێ ،من لەم سڕڕەناگەم ..

بۆچی هاوڕێم هەموو شادن ..!!

ماتەم هەر میوانم دەبێ.

2004/1/1

بەمەلی نیگات بلێ..

ئەوەندە لەسەر بانیژەی شێعرم هەڵنەنیشێ.

هەمووشتەکان ڕەنگی تۆیان گرتووە،

هەموو شتەکان لەتۆدەچن.

هەموورێگەکان لەخاڵێکدا یەکدەگرنەوە ..

ئەویش: ئەوینی_ تۆیە.

*لە گەڵ پارچەشێعری (بە پەڕەموچی-با-ویستم) لە 2003/7/7لەماڵپەری کوردستان نێت دا بلاْوکراوەتەوە

ئەو دەمەی لە کوپی قاوەگرەوەیەکدا خۆمم بینی..
وامزانی ئەورۆژەیە ،
کەبە پەرەمووژی باویستم :-
تا بلۆی بەختەوەری لەنێودڵتدا بکێشم.
من هەڵەبووم..
نەدەبوو ئەوەندە شێتانە وەدووت کەوم،
ئەم ئێستا دەبێت باجی هەڵەکەمبدەم.
لەچەقی دەریادا حەیرانم..
نازانم گەردەلولی دەریادێو
دەمبا.
یان شە پۆلەکان بەرەو بنی دەریا ڕا پێچم دەکەن..
هەرکامیانبێت هەربەرەو فەوتان دەڕۆم،
ئاخیری دەبێت باجی هەڵە کەمبدەم.
2003/5/30
*لە 2003/7/7 لەماڵپەری کوردستان نێت دابلاۆکراوەتەوە.

بەمنداڵی لەلێوی ئاڵی تۆم ئەستاندووەماچێ
بە پیریش لەزەتی ئەوماچە شیرینەم لەیاد ناچێ.
(ماموستاهێمن مەهابادی)

1
کەبەیانیان دەیبینیم ..
ڕادەوەستا .
لێوەکانی تەڕدەکردو
ماچی سۆزی بۆم هەڵدەدا.
بەدیار باڵاکەی منەوە ..
منالْ ئاسا.
بۆوەلآمی ماچەکەی ..
وڕکی دەگرت و
دەگریا .
هەتا جووابم نەدایەوە ..
قاچەکانی گۆی نەدەکرد ،کە پێیبڕوا.
2
ئەو ئێوارەی ..
کەماچێکی نێو دەمیم کرد،
کەوتە گریان .
ژێرنەبۆوە ..
تائەو کاتە کردم بەدووان.
2003/2/3
*لە ماڵپەری کوردستان نێت بلأوکراوەتەوە.
* کریڤ،ژ(12)،کانوونی دووەمی 2002

کچیٚ ئازیز،
لەبیرت دیٚ زستانی پار....
بەفریٚکی زۆر زۆر باریبوو.
جیابوینەوە،دەستە دەستەو
کۆمەڵ کۆمەڵ .
بۆ چاوشارکیٚ و
شەڕە تۆپەڵ.
من و
تۆ دژبەیەکتربوین ...
بۆ ئەوەنا ڕقمان لەیەکتر بیٚتەوە.
چاوەڕوانی فرسەتیٚك بووین...
ڕۆحمان بەماچ حەویٚتەوە.
وەلیٚ، ئەمسا لٚ لە غوربەتی بیٚتۆیدا....
نازانم چۆن دەستەکانم تۆپەڵبگریٚ.
ئەگەر دەستەکانم تەزیٚن ...
ئەی کیٚ فرمیٚسکم بۆ بسڕیٚ.
کچیٚ، هاوژین...
بڕیاریٚکەو
داومەتەواو:
(لەدوای تۆ کەسم خۆشناویٚ.
دلٚسەبوری بەکەسنایە
هەزار نەفرەت لە ڕابووردووم
بری تۆشم نەناسیایە.)
ئیدی لەگەڵ پیٚکی مەیدا ژوانەکەم..
پیٚممەڵیٚن بۆ ...!!؟
متمانەم بەهیچ کەس نییەو
ڕۆحی ماندووم ئەوینی کەس ناگریٚتە خۆ.

لە دووای کۆچت بەگومانم لە گشت کەسێ
بەچاوی من لەیەك دەچن...
پلە پەنجەکانی دەستێ.

کوردستان-سلێمانی
زستانی / 2004ز

ئەوساتانەی تۆدەبینم ..
واهەستدەکەم ڕۆژی نوێیە.
واهەستدەکەم قاسیدێکی و
پەیامی ئەوینت پێیە.

دەستەو نەزەر ڕادەوەستم ،
چاوەڕوانی پەیامتم.
وەك کۆرپەی لەشیر بڕاوە..
عاشقی گۆی مەمانتم.

جانازانم ئەوساتانەی کەدەمبینی..
بۆچی زمانت لاڵەبێ..!!
یان حەزدەکەیت تێرلەباوەشت بگرم و
سەرەتای پەیامت ماچبێ.

ڕەنگەوابێ، لەوڕۆژەوەی تۆم ناسیوە،
قسەیەکم لێنەبیستوی..
هەر بەنیگای چاوەکانت ،
خۆشم ویستوی.

*ڕۆژی نوێ:- مەبەست نەورۆزە.

-1-

لەو ڕۆژەوەی نیگای چاوم

ئاوێزانــی چاوت بـــووە.

خۆزگەی بەیەکتر گەیشتن،

لەنێو دڵما ســەوزبـــووە.

-2-

گەرچی دەترسێم گیانــەکەم

خۆزگەی دڵم وەك ناوەکەت کاڵبێ،کاڵێ.

خودایە...!! خۆزگەم بێنە دی ...

نەوەك کاڵێ ،خۆزگەکەم بنێتە چاڵێ.

-3-

ئائەوکاتەی تۆم خۆشنەویست

نەمدەزانی گریان چییە.

بەڵام ،کۆچت فێری کردم ...

کەدابڕان تاڵاو ێکە وێنەی نییە.

-4-

ڕووبارێکی سەرشێت مەبە

بەبەردەڵانی خاکی دڵمدا ڕۆمەچۆ.

تازە دڵـم پـڕە لەخەم...

ئەوینی کەس ناگرێتە خۆ.

چۆن بتوانم ..!!؟
دیمەنی ئەو سەرنجانەتبسڕمەوە .
زۆر بەوردی لێتدەڕوانیم،
کەلەخوێندن دەهاتمەوە.
چۆن بتوانم..!!؟
ئیشارەتی ئەوڕۆژانەت بیربەرمەوە .
کەبەدەم خەندەو
نازەوە.
جووابی ئیشارەتی منت دەدایەوە.
چۆن بتوتنم..!!؟
شەڕە تۆپەڵی ئەوڕۆژەبیربەمەوە.
کەلەڕێگەی قەتا بخانەدەستمان پێکرد ..
تاماڵەوە.
بەرلەوەی بگەینەملێ..
خۆمانتەکاند.
دەستمانکردە ملی یەك و
خۆزگەیەکی زلمان درکاند.
وتمان:

خۆزگە بۆیەکدەبووین.
من بەوم گوت:
گەربێوەفای نەنوێنی .
ئەو پێمی گوت:
گەربێوەفای نەنوێنی.
بۆیەکدەبین.
چۆن بتوتنم..!!
ئەو دیاری و

وێنەو نامانەت ..
کەلەلامن بسوتێنم.
چۆن بتوتنم ..؟؟
هەموو ئەورۆژەخۆشانە..
لەدڵدەرکەم .
عەڵقەی ئەمڕۆی مارەبڕی و
سبەی حەفلەی گواستنەوەت لێپیرۆزکەم.
*ساڵی 2003لەماڵپەری نوسەری کورد بڵاوبۆتەوە.

میحرابی ئەبرۆی تۆم هەبێ، باڕووم لەقیبلەهەرنەبێ
دینم بەعیشقت گۆڕییەوە ،هەرچی دەبێتن بابێ.
( موخلیس )

1
دورڕدۆنگ مەبە
کەدەبینی ..
وەك درەختی سەرشۆستەکان،
بۆدیدارت ڕاوەستاوم.
کەدەبینی ..
وەك سێبەرت لێتئالاوم.

2
ئەی گوڵەباخ..
بەهاریمن..
لەگەڵهاتنی تۆدایە.
کەتۆنەیەی ..
ئەویش نایە.

3
دورڕدۆنگ مەبە
کە پێت دەڵێم :
دوور لەدەریای سۆزی سینەت ..
ماسییەکی بەبێئاوم.
دوور لەلێوت ..
لەدەریای غەماخنکاوم.

4

تائەوکاتەی ..
سەرم نەخستەسەرڕانت
لێوم نەنا بەلێوتەوە .

نەمزانی ،کەبەهەشت دووانە ..
بەلاّم،ئەورۆ..
بەهەشتی خووام بیرکەوتەوە.

5
دوڕدۆنگ مەبە
کە پێت دەڵێم :
بۆکوێ بڕۆی لەگەڵت دێم.
وەکو مۆمێك ..
لەڕێگەی تۆدادەسوتێم .

6
نازدارەکەم..
نەکەی هەرگیز ئەوساتانە لەبیربکەیت
جەستەو
ڕۆحمان،بەیەکدەبوون .
لەنێو یەکدا بەشێوەیەك دەتوانەوە..
لەیەك دەچوون.

2003/3/17
* لەماڵپەری نوسەری کورد دابلاّوکراوەتەوە
*لەگۆڤاری گولاّن،ژ( 431 )،1یئایاری 2003، دابلاّوکراوەتەوە.

لەبەرچاوی جیهانبینیم،وەها تاریك بوونەمزانی
نەنووری چاوەکانم چوو،نەخورشیدی جیهان ڕۆی.
( وەفای )

1
کێدەڵێ قەدەر بەتیل وەرناگرێ ..؟!*
ئەو قەدەرەی من دەیناسم ..
بەرتیل خۆرەو
بەبێ بەرتیل هیچ کارێکی پێناکرێ.
ئەفسوس ، منیش..
هیچ سەرمایەیەکم نییە..
پێی ببەخشم ،
ئەم بەرتیلە شێعرە نەبێ.
هەتاوەکو..
نازدارەکەم..
تیری نیگای لەدڵەی پڕغەمم بگرێ.

2
کێ دەڵێ قەدەر بەرتیل وەرناگرێ..؟!
ئەوەتانێقەدەری شوم ..
ڕێگەدەگرێ .
نایەڵێ ،کە دڵەی شەیدام ..
بۆ چەند ساتێ ئارامبگرێ.
هاوژین-ەکەم..
ئەوەتانێ دەستی قەدەر ..
پەڕەی ئەوگوڵانەش دەوەرێنێ.
کەلە چووانێکدا بۆنتکرد،

ئەوەكو بۆنی تۆی لێبێ.

*دێرەشیعرێکە لەقەسیدەی ( بانگهێشت )ی شاعیری عارەب ( ئەحلام موستەغانمی )

2003/4/7سلێمانی

،لە ماڵپەری نوسەری کورد دا بڵاوکراوەتەوە

1
لەوساتەوەی تۆ ڕۆیشتوی
ڕقم لەخۆم دەبێتەوە.
زۆردەترسم گیان و، جەستەم ..
بەدەستی خۆمجیابێتەوە.
2
لەو ساتەوەی تۆڕۆیشتووی،
( ڕەنگی پایزم گرتووە )
شادی لاملێناکاتەوەو
( دزێوی ڕیزی گرتووە )
3
لەوساتەوەی تۆڕۆیشتوی ،
خودا!! ئاوا تمی کوشتووە.
خەڵکی دەڵێن :-بۆچی هێمن ..!!
ڕەنگی مردووت لێنیشتووە .
4
بەلام،کچێواتێنەگەیت..
کارێکی باشت کردووە.
ئەمەیەکەم شکستنییە !!
زۆر جارشکستم حوواردووە.

سەرنج :-
*نیوبەیتی نێوکەوانەکان لە شێعرێکی مامۆستاهێمنی مەهابادی ( کوردستانی ) وەرگیراوە.
*ئەم شێعرە لەهەردووماڵپەری نوسەری کورد ودەنگەکاندا بلاو کراوەتەوە.

چۆن دڵتدێ جێمبهێڵی ..!!؟
کەمن دڵم لەلای‌تۆیە ..
ئەی‌نازانی عاشیق کاتێ‌دوورەلەیار !!؟
هەمووژینی ڕەجەڕۆیە.
وەرەو مەڕۆ ..
نەباڕەنگی پایزبگرم.
نەبا لەدووریتا بمرم.
دەترسێم پەپولەی ڕۆحم بژاکێنی و
بۆئەم کۆچەلەناکاوەت ..
وەك پەروانە، بۆهەمیشە ئۆقرەنەگرم.

کەتۆ دێی ڕەنگی ڕەشی فیراق ..
نیشتیمانم جێدەهێڵێ.
کەتۆ دێی شنەبای سۆز هەڵدەکاو
باچەکان پڕدەبن لەبۆنی بەرائەت.
ئـــــای!!لەو ساتانەی کەتۆ دێی!!!
هەستدەکەم لە پیری موغانەوە ..
دەبمەوە بەکوڕێکی چواردەساڵ.
هەستدەکەم لەنویدروست دەبمەوە.
هەستدکەم لەئاویلکەی تەمەنەوە..
دەچمەوەنێو نۆبەهاری ژین.
بەخێربێی پەری ئەوینم..
ئای لە یەکەمین بەیانی پێموتی:-
خۆشم دەوێی..
تۆوتت:-
نا
مردم و
زیندوبومەوە.
مردم بۆئەوەی ،وتت:-نا.
زیندوو بوومەوە بۆئەوەی
جارێکی دیکەش پێت بڵێم :-
خۆشم دەوێی.

2004-4-20

الفراق: البين: الغربة لێرەدا بەمانایالنوی:البعدبەکار هاتووە.

1

ئەوان هاتن..
گریان لەباخچەکان بەرداو
کانیاوەکانیان تینوکرد.
ئەوان هاتن..
شۆستەکانیان پێچایەوەو
عەردی خوایان لەئێمەی مرۆڤ حەرامکرد.
ئەوان هاتن..
مەمکی ژنەکانیان بڕی ..
ئەو ژنانەی بەقەدەری خودا.
لەدوای مەرگیش..
شیری کۆرپەکانیان دەدا.

2

ئەوان دێن ..
زارمان ببەستن و
بمانکەنە قەرەجێکی پێپەتی.
کەچی ئێمەدەچین و
دەیانکەینە فریاد ڕەس.

3

ئەوان دەڕۆن..
دەترسن ڤینی جەماوەر بیانکوژێ .
کەچی ئێمەدەیانهێنین..
لەژێر یەك پێخەفدا،
دەگەڵ ژنەکا نمان دەیاننوێنین.

1
ڕۆژانێکی زۆر ..گیان دڵەی تەنیام
ئەی ناڵاند بۆتۆ ،ئێستاکەش هەروام.
جاران بۆدوریت دڵم پڕغەمبوو!!
نەمزانی چلۆن تۆفریوتدام.

2
جاران چاوانت بانگی دەکردم
کەچی ئێستاکەلەمن هەڵنایە.
جاران ڕوخسارت پەری ئاسابوو
ئێستا ڕووانینت پڕلەهەرایە.

3
دەترسێم ئیدی نەتبینمەوە.
سەفەرت هێندە دوورودرێژبێ.
فارگۆنی عومرت لەکەنار مەرگا ،
ڕاوەستێو،خودا گیانت دەربێنێ.

4
بەبێدەنگیتا دیارە تۆراوی
بەلاّم من مەیلم هەرلەلای تۆیە.
هەرگیز ناتوانم لەیادت بکەم
هەرچەند بەڵێنت پڕلەدرۆیە.

5

تازە تەواو ڕۆژانی زووم
بابڕواو قەت نەیەتەوە .
نە با بەڵێنی ئەمجارەش ..
هەورێکبێوبڕەوێتەوە.

6

دە دەروازەی دڵم بەردە..!!
دڵم بۆکەس ناکرێتەوە .
هێندەم تاڵاوی‌عەشق چەشتووە،
دڵم قەت ئاشت نابێتەوە .

# بۆ: هاوژین ، ئەوی ژیانی تاڵکردم

کچێ ئەوەندە هارمەبە..
هارمەبەو
لە پە نجەرەی دڵمەوە خۆتمەکە بەژوردا.
ئەگەرهاتیت لەدەرگابدەو
کەمێك  چاوەڕێبکە تائیزنت دەدەم.
نەبادا فریای خۆکۆکردنەوەنەکەوم..
نەبادا  پێخەفەکەم خیانەتی ئەوشەوەت بۆبگێڕێتەوە،
کەتۆم لەبیرکردو
بەدەمخەیاڵەوە شەیتانیبووم.
شەیتانیبووم بەبێوە ژنەوەی،
کەچەقۆی ڕۆژگار جەرگی لەت لەت کردبوو..
فرێی دابووە نێودوورگەی چاوەڕوانی ..
تا یەکێك لەدەرگای بدات و
بیگێڕێتەوە بۆشەوە پڕلەززەتەکانی جوتبوون.
نەبادا ئەوکاتەیدێیت ..
گوێلەگۆرانییەکانی ( عەدنان کەریم ) بگرم،
چونکە تۆ تورەدەبیت ،
تۆرقت لەترازاندنی بەندی سوخمەی ئاڵە .
تۆدەڵێیت:-
ئێمەهەمیشە بەرۆح تێکەڵی یەکترین..
ئیدی چپێویستیمان بەئاوێزانبوونی جەستەیە.
کچێ ،ئەوەندە لەناکاومەیە،
نەبادا ئەوکاتەی دێیت ..
پێکە بادەی کامەرانیم لەدەستدابێت،
تۆرقت لەبادەیە.
تۆ دەڵێیت :-

تینویەتی ڕۆحت بەبادەناشکێت ..
تامەزرۆیت کۆبکەوە بۆشەوی بەهاوسەربوون،
ئەو شەوە بادەی لێوەکانم بخۆرەوە.
مەست دەبیت ..
مەست، مەست.

هەنوکەڕقم لەهاتنتە..
مندەمەوێت بەهاتنت مەستببم،
نەك بەمەستی بێیتەلام.
هاوە- گیان ..
بمبورە کەئەوەندە تووڕەم،
پێتنالێم :بۆئەوەندەتووڕەم..
لەئەستێرەی ئاسمانبپرسە ،
یان لەشۆستەی بەرماڵەکەتان..
یان لەودوکۆترە عاشقەی بەسەر هەورەبانی ماڵەکەتانەوە..
هێلانەیان چێکردووە
یان..
یان و ..یان
ئەوان وەڵامتدەدەنەوە!!..
خۆلەدواهەمین نامەی شیعریمدا ..
بۆم نوسیت،
بەهوماناوزەدم کردیت..
تاهێلانەی بەختەوەری لەدڵمدا چێبکەیت و
بەیەکجاری بارگە بخەیت.
کەچی تۆهەر ڕێیووارانە گوزەردەکەیت بەناخمداو
ئەوکاتانەی تۆدێیت..
من تەنها جەستەم لێرەیەو

ڕۆحم مەستە .
ئەوکاتانەی مندێم،
تۆلەوێنیت .
*بڕوانە هۆنراوەی ( کەدەمبینی ..کەدەتبینم )
کەلەماڵپەری کوردستان نێت بلاٚوکراوەتەوە
شەوی 13/14-5-2003
*لەنوسەریکورد دابلاٚوکراوەتەوە

ماوەیەکە دڵم تەنگەو ...
هەرچەند دەکەم،نازانم بۆ!!
لەدووری دوو چاوی جوانتە
یان بۆ عەشقێکی سەرە ڕۆ.

ماوەیەکە دڵم تەنگەو...
چاوەکانم ئەسرینی غەم ئەبارێنیٚ.
شەوی یەڵدای نائومێدیـــم ...
حەزوو خۆزگەم ئەتارێنیٚ .

ماوەیەکە دڵم تەنگەو...
لەبەچاوم هیچ شتێك وەك خۆی نەماوە.
جانازانم غەمی بێمروەتی تۆیە
یان بەڕاستی هەموو دنیا شڵە ژاوە.

ماوەیەکە دڵم تەنگەو...
ئەستێرەکانی خۆشنودی ناجریوێنن.
نامە و... یادگاری ڕابووردووت...
هەمـــوو شەویٚ دەمـــــگرینەن.

ماوەیەکە دڵم تەنگەو...
گویٚ نادەمە وانەکانم .
بۆ دۆزینەوەی هەوارگەت
گەڕیدەی کۆڵانەکانم.

**2005−apr.−4**

**نازدارەکەم...**
**خورپەی دڵە تەعزێبا و**
**بێدارەکەم.**
**بۆ نەهاتی ...!!؟**
**هیوای دڵە پڕتاسەکەم.**

**لەو ڕۆژەوە هەتا ئەمڕۆ ...**
**خۆتاسەی دڵم نەشکاوە.**
**لەچاوەڕوانی ،نیگاتدا...**
**ژینی خۆمم وەلاناوە.**

**من وامزانی...**
**دەڕواتەوە خۆی جواندەکات..**
**کەچی ئەفسوس...**
**تادواساتی ئاهەنگەکەش چاوەرێ بووم،**
**نەهاتەوە.**
**لەرێ_ ئاهەنگەکە خۆش بوو..!!**
**بەڵام دڵم جگەلەتۆ ئاوڕ لەکەس ناداتەوە.**

**لەدوای هاوژین...**
**تۆ یەکەمین کەسی کچێ.**
**ڕەفتار و...**
**جوانیت لەو بچێ.**
**بۆیە جارجار بەهێمنی لێت دەڕوانم،**

بەڵکو ڕۆژێك بێت بتوانم...
دەرگای گفتوگۆی نێوانمان بکرێتەوە.
بەخەندەو ...
غەمزەی چاوانت...
دڵەی شەیدام ژێربێتەوە.

سەرم سوڕما ...
کەهێندە زوو ڕۆشتیتەوە.
پێوانەبوو کەڕۆیشتی نەیەیتەوە،
منت لەبیر بچێتەوە؟.

تۆ خۆت جوانی ...
کەی پێویستیت بەمیکیاج و
ماسکارایە.
قەینا دڵم لێت دەبووریٚ..
چونکە نەزمی سروشت وایە.
بەڵام گوڵم...
خۆگلەی من لەوەیە.
تۆی سەرۆك کۆماری دڵم
ئاگات لەم حەزە شێتەیە!!
پێموانی ئاگاداربی و
لەدەردی دڵم تێبگەی.
لەسەرنجی چاوەکانم ..
بەئەنجامێکی نویٚبگەی.
دەنا،گوڵم...
یەکەم نیگابوو ،پێمووتی:

دڵەی شەیدام تۆی خۆشەوێ .

تۆ کاندیدی عەرشی دڵی و...

وڵاتی دڵ بەعەشقی تۆ سەردەکەوێ.

**8-APR.-2005**

ئەم شێعرە لە ئاهەنگی بەسەرۆک کۆماربوونی بەڕێز تاڵەبانی –دا نووسراوە.

تەوافی کەعبەو زەمزەم بەبۆسە*ی لێوەکەت نادەم
شەرابی شەوقی ڕوی تۆم بێکافییە بەحسی دین ناکەم.
( مەلا حەسەنی فانی )

چۆن بیرت چوو..؟!؟!
کە پێمووتی:-
خۆشم دەوێی..
دەتپەرستم هەتا مابم.
تۆش پێت وتم:-
ئاخر هێمن ..
من چۆن لەوە دڵنیابم.
هێندە بە سۆزەوەوتت..
لەڕۆحیشم کەوتمە گومان.
پیرۆ زییەکانم وەلا ناو
ناچار سویندم بەچاوت خوارد،ئەی چاو جوان.

وەلێ،کچێ..
بیرت نەچێ..
لەو ڕۆژەوەی سوجدەم بۆ چاوت بردووە.
تەریقەتم بیر کردووە. (1)
خەڵکی دەڵێن :-
لەدینی پاشگەز بۆتەوە.
وەك سامیری..(2)
بۆبتپەرستی چۆتەوە.

ئیدی گوڵم..
چۆن دڵت دێ‌جێمبهێڵی..؟!!
که من دڵم له‌لای تۆیه.
بۆ نازانی عاشیق کاتێ دووره له‌یار ..!!!؟
له ژیانی ڕه‌نجه‌ڕۆیه.

وه‌ره‌و
مه‌ڕۆ..
نه‌باره‌نگی پایز بگرم.
نه‌با له‌دووریتا بمرم.
ده‌ترسێم په‌پووله‌ی ڕۆحم بژاکێنی و
بۆ ئه‌م کۆچه له‌ناکاوه‌ت..
بۆ هه‌میشه ئۆقره‌نه‌گرم.

بۆسه :- مـــــــــــــــــاچ.
(1) مه‌به‌ست ته‌ریقه‌تی قادرییه.
(2) ناوی ئه‌و جادووگه‌ره جوله‌که‌یه‌یه،که په‌یکه‌رێکی بۆ گای( ئه پیسی میسر)ی داتاشی و به جوله‌که‌کانی وت تاله‌جێگه‌ی خودای خالیق په‌رستشی بۆ بکه‌ن،وه‌لێ‌حه‌زره‌تی موسا ( خودا ڕازداری بکات )له‌نێوی بردن و بیرو باوه‌ڕه‌که‌شی له‌ڕه‌گه‌وه‌هه‌ڵکه‌ند.

دکتۆری تەشریح پێی وتم :-
خێرا هەستەو
وەرە پێشێ.
وتم :دکتۆر گیان ببورە..؟؟
هەستەکەم هێزێکی نادیار ڕامەکێشێ.

بەتورەییەوەوتی :-
پێمبڵێ ئەوهێزە چییە.
وتم :-ئەوین..
وتی :ئەوین شتێکە هیچ مانای نییە.

وتم :- دکتۆرگیان ببورە..
بڕوات هەبێ..
سەعاتێکە من نازانم چیباسەکەی.
بمبوورە دکتۆر ئەزانم..؟؟
لە دڵی ئەویندار ناگەی.
لەبیرم دێئەو دکتۆرە ڕۆژێ وتی :-
( ئەخسائی ) مانای خەساندن..
گەر نەخەسێی نابیە دکتۆر..
من وامزانی بەڕاستێتی و
خۆی خەساوە.
هاوڕێکانم وتیان :-بەڵێ..
پارئەم کاتە پێمانەوت دکتۆری بوخچە نەکراوە.
کەچی لەکۆتای سالأخوێندکارێی سەرکەوت و
جوانی هەڵبژارد،هەتاوەك ببێ بە زاوا.

بۆ ( دیلمانی حاجی جەماڵی ) هاوڕێم، ئەو مرۆڤەی ڕۆژێك نەچوایەتە زانستگە و ئەویندارەكەی نەدیتایە هەستی بەتەنیای و، غەریبی دەكرد.

كە بەیانیان دێمە دەر و
بۆ زانستگە هەنگاو دەنێم.
بەبینینی چاوەكانت ..
واهەستەكەم كەسێكی نێم.
وەلێ، كچێ..
تا ئەوكاتەی تۆ نەبینم
خۆرهەڵنایە.
چەنكە خۆریش وەك تۆ وایە.
تا تۆنەیەی..
ئەویش نایە.
وەك چۆن مانگیش ..
بەبینینی ڕوخساریتۆ ، شەرم دەیگریۆ
قەت هەڵنایە.
2004-1-17/16
6,20دەقیقە

کەد ەمبینی..
سەردامەخەو
بەبزەوەلێم بڕوانە.
لەو ڕۆژەوەی کە تۆم دیووە..
عاشقتبووم وەك دێوانە.
هەموو ڕۆژێ،
چاوەڕێتم.
لەسەر ڕێگەتدا دەوەست،
دووعادەکەم کەزوو بەربی و
گەڕێیتەوە.
ئەمە خوایە!! بەعیشووەوە لێمبڕوانی و
ڕۆحیماندووم حەوێتەوە.
بەس نازانم !! کەدەمبینی..
بۆچی هێندە سەردادەخەی..!؟!
ڕەنگە خاوەنی یارێك بی و
بلێی ئۆخەی.
وەلێ ، کچێ دڵنیابە..
ڕۆژی سەدەن یارت هەیە.
ڕۆژی چەندین کەسی وەك من ..
بۆ چاوانت پەروانەیە.
دەتوخوا تۆش ! دەستمەنێ بەڕومەوە.
ناڵێم بلێ خۆشم دەوێی..
ئاورێکم لێبەرەوە.

ز2003-10/26/25

ئەی یار..

ئەی هۆی عەزابی ڕۆحی من..

گیانە یەکەم حەرفی شێعرم بۆتۆ نوسی..
کەچی وائەمڕۆ خەریکە لەبیرخۆمت دەبەمەوە.
واخەریکە بۆئەوڕۆژە دەڕۆمەوە ..
کەبەرلەتۆ شنیاری بیوەفام ناسی.
نا.. نا.. ئەوبێوەفانەبوو ..
قەدەر پڕبوو لەکەساسی.
دەنا ، خۆشنیار پێیوتم :-
هێمن_ەکەم ، وەرە سوێد..
هەتاوەکو بەیەکبگەین.
هەتاوەکو لێرە یەکتر مارەبکەین.
ئاخ!! نەداری ،چلۆن نەتهێشت ..
بەشنیاری تاقەیارو
هاودەم بگەم.
ئاواش نەتهێشت..
بەیاری دووای یارم بگەم.
بڵێی لەدووای ئەم دوویارە ..!!؟
یارێکی دیکەبگرم و
هەرپێی نەگەم.
ڕەنگەوابێ..
چونکە بەرلە هاوژین_ەکەم..
شارام خۆشویست..
وەلێ،زەمەن ڕێگەی نەدام ،کە پێیبگەم.

1

تاکەی فرمێسکی خوێنین
لەچاوانم دابارێ.
گوڵم تۆکەی دێیتەوە،
بۆنێوکۆنەهەوارێ.

2

هەوارم چۆڵەو وێران ،
گرمەژووانی یاران.
لەغوربەتدام دەمێکە
دەژیم بەیادی جاران.

*ئەشێعرەلە ژمارە90ی 2001/2/10ڕۆژانەی سلێمانیدا بلاْوکراوەتەوە.

تەنیای منە و

منیش تەنیای..

هێندە لەدەریامەڕوانە ،
ڕەنگی شە پۆڵت گرتووە.
دەترسێم سەفەرکەیت و
گەڕانەوەت لەدووانەبێ.
نازدارەکەم..
ئیدی شوێن پێی ئەو پەپولانە ناخوێنمەوە.
لەسەر پەڕەی ئەوگوڵانە دایانناوە و
هێور هێور بۆن بەئایندەوە دەکەن.
بەو گەشتییە پواوەوە..
بۆکوێدەڕۆی !!
تێشوت پێنییە بۆسەفەر ،
چۆن بەقسەی ئەوکا پتنەڕەشتاڵیەبڕوادەکەی.
تۆ دتەوێت بەتەنیایم بسپێری..
دەماڵئاوا ..
خۆ لەمێژەمن تەنیایم ڕامکردووە.
من و
تەنیای یەکێکین.
تەنایای منە و
منیش تەنیای.

لەو ڕۆژەوەی بەجێت هێشتووم
یادگاری ئەو شەوەی ...
کەبەدەم کزەی هەناسەمەوە دەگریایی...
ساتناساتێك ئەوکم دەگرێ.
لەوڕۆژەوە ناتوانم..
لەگەڵای زەردی پایز بڕوانم.
چونکە وێنەی وەریوی تۆی تیادەبینم...!!
ئای لەو ڕۆژانە...!!!
کۆترەکان لەگمەو...
چۆلەکەکان لەجریوەو...
توتیەیەکانیش لەعاشقێتی کەوتبوون.
بەسەرسامی لەئەوینی من و...
تۆیان دەڕوانی.
هەتاوەکو زێدەتر فێری ئەوینبن...
کەچی لەگەڵ فێرکردنی ئەوان ،
تۆش فێری فڕین بووی لەقەفەسی سنگم.
ئیدی ئێواران بەدەم هەنسکەوە دادەنیشم ..
لەسەر مێزێك هەتاوەکو پێکی بادەمەستم دەکات.
ئیدی ئێواران لەزەردەپەڕناڕوانم...!!
بەسۆزەوە حافز و...
جامی ناخوێنمەوە.
چونکە هەنووکە من و...
تۆ چیرۆکێکی نەنووسراوین .
من دڵنیام جامی بۆ خۆی لەودونیا دەینوسێتەوە.
تا ئەوساتەی بەئەوینت ئاشنانەبووم،
گریانم بۆ شێعرەکانی نزار دەهات.
هەستم دەکرد خۆی لێونەو ...

لەتەنکاوەکانی ئەوین دەخولێتەوە.

هەستم دەکرد بێجورئەتەو...

ناوێریێبۆ پانتای ژن شۆڕبێتەوە.

*حافز :حافزی شیرازی کەڵە شاعیری فارسە.

*جامی:نورالدین عبدالرحمان (817ك-897ك)یەکێکە لەنووسەرەمەزنەکان کە46 کتێبی هەیە و زۆربەیان لەسەر ئەوینە،وەك یوسف وزوڵەیخا- لەیل ومەجنوون،وەهەندێك لەبەرهەمەکانی تەسەوف و،دەروێشییەو هەندێکیشیان نەح و سەرفە.

*نزار:مەبەست لە نزار القبانی مامۆستای جوانی ناسییە.

جاران بۆ دووریت دڵم پڕ غەمبوو
ئێستاکە دڵم وەکو بەرد وایە .
چونکە ئەو دڵەی ئەوین دەناسێ..
شێتە،سەرگەردان،سەری هەودایە.

جاران هۆنراوەم بۆ تۆدەنووسی
ئێستا پێنووسم حەرفی پیانایە.
مەرگی ناوادەی ئەوین داریمان
پێی وتم ئەوین چەند بێبەهایە.

جاران هاوارت بانگی دەکردم
کەچی ئێستاکە هیچ دەنگت نایە.
وادیارە مەیلت هێندە گۆڕاوە
دڵت بەدەنگم سەبووری نایە.

جاران بۆ دووریت شینم دەگێڕا
ئێستا خورپەیەك بەدڵمانایە.
تۆهێندە دڵت ڕقبێ لەئاستما
ئیدی چۆن ئەوین کۆتای نایە.

**-1-**

**ماوەیەکە دەنگت نیەیە**
**بۆیە هەواڵت دەپرسم.**
**واتێنەگەی بیرم کردوی!؟**
**لەدابڕان زۆر دەترسم.**

**-2-**

**زۆرم نامە بۆ هاتووە**
**بەڵام جێگەی هیچ ناگرێ.**
**هیچم تیانەخوێندوونەوە**
**لەهەست وسۆزی تۆ بچێ.**

**-3-**

**ئێستا ناوێرم وەك جاران**
**سەیری وێنەکانت بکەم.**
**دەترسێم لەدەریای ئەشکا**
**بەرەو مردن گینگڵ بدەم.**

**-4-**

**کە ئێواران تۆدەبینم**
**من خۆمم بیر دەچێتەوە.**
**هێندە مەستی چاوت دەبم**
**بەئەستەم خۆم بیردێتەوە.**

**بۆ:لەریَ ،ئەوی ئەم شیٚعرەی خستەوە**

**کەتۆ نەیەی...**
**منیش ناچم.**
**دوابڕیارت بدرکێنە ...**
**خۆلەبڕیارت دەرناچم.**

**خۆشی کۆڕاڵ**
**لەنێو نیگای چاوت دایە.**
**تۆی لێنەبی و...**
**لێم بڕوانی ...**
**خۆشی بۆدڵی من نایە.**

**لەڕێوە دیم...**
**تۆنەهاتووی ،**
**بڕیارمدا نەچمە چووریَ.**
**ترسام بڵی بێمروەتی و ...**
**دڵم هەرگیز لێت نابووریَ.**

ئەزانن..؟؟
کە پەپوولە گوڵە بینێ..
بزە دەگرێ.
کەگوڵ پەپولە دەبینێ..
تێر دەبزوێ.
بەزوبانە منالێ ئاساکەیان..
ناز دەکەن و،
بەچاوان و،
بەلێوان و..
بەهەردوو دەست..
بەلە نجەو لار،
ئیشارەت بۆ یەکدی دەکەن.

ئەمشەو..
لەگەڵ دووایین وشەکانی ماڵاوایت توامەوە.
هێندە مەست بووم بۆ دیدارت..
لە قیبلەگەی چاوەکانتا گیرسامەوە.
وامدەزانی ئەمە قسەی فاڵچی یەکەیەو
بۆ باوەشی پڕلەسۆزت گەڕاومەوە.
**
نا گیانەکەم..
بەرقەوە لێممەڕوانە.
چاوجوانەکەم، عەشقی نیگای ..
پڕئەوینتم ،بۆیە بۆت بووم بەدێوانە.

عیشق ئەو پەپولەبالسوتاوەیە
بەشوێن گوڵێکدا ڕادەکاو
پێی دەخزێ،
لەناو شەرابی لەززەتدا نغرۆدەبێ.
لەکوێن ئەودەستەڕەشانەی ..؟!!
گوڵی عومری ئەوخاتوزینانەیان..
لەئێوارەیەکی پایزیداهەڵپڕوچقاند!!..
لەکوێن ئەوکوندەپەپووانەی..؟
نامەی کوشتنی ئەوگوڵە مینایانەیان،
لەژێرباڵیاندا هەڵگرتبوو.
وەلیدێت و
شەم سنگیدەکات بەگوڵدان.
مەرگەوەڕ دێو
نامەکانی خەونی خۆش نودی دەپێچێتەوە.
مانگ درزی برد،
سێوی لەزەتی لێکەوتەخوار.
خۆرزاو پرچی تۆی لێبوو.
پرچی تۆزاو
تەزوی لەزەتێکیلێبوو.
لەززەت بووبەکوانوی گڕو
جەستەی ڤینۆسێکی سوتان.

*لەژمارە25ی 2001/1/27ی هەفتەنامەی ڕۆژی گەل دابلاوکراوەتەوە.

پێشکەشە بەوهاوڕێخۆشەویستەم ،کە پاش تێکەڵاوبوون لەگەڵ سیاسەتدا کوشتیان ،بێئەوەی هۆکاری کوشتنەکەی بزانرێ ،وەلێ بەداخەوە بکوژانیشی دەستگیرنەکران.

لێمببورە تائەم ساتەهیچم بۆتۆنەوتووە..

لەسەر وەسیەتەکەی باوکم ..

زارم لەجنێو کەوتووە.

ئەگینا قەحبەنە ئەوانەی بەناغافڵ ..

تۆی تازەلاویان کوشتووە.

قەحبەیەکی ئاسای،نا..!!

ئەو قەحبانەی شەوی سوری بەرپرسانیان..

ڕێکخستووە.

یانی: دەلاڵ..

ئەودەلاڵەی بەناوگەڵی پارێزگار 1و

ئەوانی دی مەست کردووە.

ئەگینا بۆ؟!!تائەمساتە..

هیچ کەسێکیان نەگرتووە.

یان ئەم شارە ..2

شارێکی بێحاکم بووە.

یان وەك کوردەواری دەڵێ:-

ئەم ماستەمووی بەرپرسانی تێکەوتووە.

ئەی هاورێ گیان..

گیانت شادوو

بەهەشتی بەرین جێگەتە.

من دەزانم لەوەدنیاش ..

دڵخۆشکردنیمنالاَن هەر خۆزگەت.

زۆر بەجوانی بیرم نایە !!

کەمناڵ بووم شۆخیت لەگەڵدا دەکردم.

تێر تێر دەتنام بەسنگتەوە و

بەرەو لای وەزڵێت 3دەبردم.

ئاخ!!منالْی ..

شەللاْ، گەورەنەبومایە.

هەتاوەکو جگە لەچاوشارکێو

جۆجۆ..

هیچی ترم نەزانیایە.

من دەزانم ..

ئێستا گلەیم لێدەکەیت..

دەڵێی بۆهێندە بێدەنگی !!

بەلاْم ،چیبکەم ئازیزەکەم ؟

ڕەخنەو جنێو بۆتەلەنگی!!

ئەمە ئەگەر لە پێناویا تیرۆرنەکرێی

بەرەو زیندانی تاریکی حیزب نەبرێی.

1-مەبەست لەبەرپرسانە کەبەشێوەیەکی گشتی ئەرکی پارێزگاری هاولاْتیانیاندەکەوێتەئەستۆ، نەك مەبەست محافز بێت.

2-یەکێکە لەشارەکانی کوردستانی گەورە.

3-کانییەکە دەکەوێتە پشت ماڵەکانی گوندی بەرزنجەو خەڵکی ئێواران بۆکاتبەسەربردن ڕویتێدەکەن

سەرنج:- لەبەر نەبوونی ئازادی تەواو نەمتوانی پەراوێزەکان بەڕونی و تەواوی بنوسم..

سلێمانی 2004/8/26

*ئەمشێعرە لە 2004/8/31ز دا لەماڵپەری کوردستاننێت دا بلاْو کراوەتەوە ،هەروەها لە نوسەری کوردیشدا.

بۆ :باوکم ..بۆ: دایکم..

من دەزانم سلێمانی دەبێتەهێرۆشیما و

هەڵە بجەش بیردەچێتەوە.

ئەفسوس ،ئەمیش ..

وەك ئەنفال و

کۆرەوەکە ..

دەچێتە نێو بیرەوەری و

مێژووەوە.

وەلێ،قەینا ..

چونکە فێرین زوو ڕابردوو لەبیرەکەین .

ئایندەش ناخوێنینەوە.

2

وەسیەتێکەو

لەدوانامەی بەرلەمەرگما بۆتدەنوسم .

ئەبا ئیدی نامەی منت نەگاتەدەست

ئەگەر مردم ،بە پێنوسم..

لەسەر گۆڕەکەم بنوسە ( عومەری خاوەر)

بامەرگی من مەرگی عومەری حاوەربێ.

چونکە پاش چەند ڕۆژێکی دی

سلێمانیش وەك هەڵە بجە لەیادەکرێ.

2003/3/19

ئەم شێعرە لەماڵپەری کوردستان نێت دابلاْوکراوەتەوە.

1

ئەی ولآتەڕەشپۆشەکەم
لەو ساتەوەی تۆیان کردۆتە قاقنەس ،
منیش غەریب و
ئاوارەم.
لەبیابانی ( عەرعەر )دا
بەشوێن( گۆڕی ) بزربووی خۆما دەگەڕێم.
ئەمەخوایە بیدۆزمەوەو
چاوەڕوانی قەدەر بکەم .
بەڵکو ڕێبوارێ بهێنێ،
ناوی خۆمو
هاوەلآنم .
لەسەر گۆڕی بەبێکێلمان هەڵبکەنێ.

2

بڵێی ڕۆژێ وەکو هاوەلآنی ئەشکەوت..
پاش دەیان ساڵ،
یەکێکتان بگەڕێتەوە ..
بۆزامی دڵی ولآتم ..
هەتوان بێنێ.
بڵێی ڕۆژێ عیسای مەریەم..
گەڕێتەوە،
بەئیزنی خوا چەند شەهیدێ
بەزیندوی ..
لەگۆڕەکەی دەربهێنێ.
ئیدی چاوەڕوانی ئەنفال ببڕێتەوە.

ئاخ !! نیشتیمان ..
لەو ڕۆژەوەی،
پەڕەیگوڵی باخچەکانی تۆیان وەران .
دەستەکانم کەوتنە لەرزین ،
چاوەکانم هاتنە گریان .
ئاخ !!..نیشتیمان..!!
من نازانم ..
باخەوانی باخچەکانی ئەم وڵاتە ،
چۆن دڵیان هات ؟!..ببنەزێوان
بۆناشتنی تەرمی گوڵی..
باخچەکەیان.
ئاخ !! نیشتیمان ..
ئەگەر قەدەر دەروازەی بەختم کاتەوە.
هێندە دەڕۆم ..
هەرگیز هەرگیز نایەمەوە.
ئاخ !!..کوردستان!!
* ئەم شێعرە بڵاوکراوەتەوەلە :-
1-ماڵپەری کوردستان نێت،دا.
2-لەماڵپەری نوسەری کورد،دا.

ئێمەنیشتیمانێکمان هەبوو لەبەفر،
پرشنگی خۆر بێرەحمانە تاوی سەندوو
وەرزی گەرماش گەرایەوە.
بەرلەوەی بچینە ناوی..
نیشتیما نمان توایەوە.

ئێمەنیشتیمانێکمان هەبوو..
لەرەژوو،
دڵۆپەنەوتی تاوان کار..
خۆی رژاندە سەرجەستەی و
شەمچەیەکی بێویژدانیش ..
خۆی داگیرسان.
خۆی فرێدایە سەرنیشتیمانی ئێمەو
هەموو سوتان.
ئێمەنیشتیمانێکمان هەبوو لەخۆڵمێش
رەشەبایەك خۆی هەڵسوران.
نەی هێشت تیا بحەوێینەوەو
هەمووی فران.
ئێمە نیشتیمانێکمان هەبوو ..
پێی دەوترا کودستان.
زۆر لەلاوان، لە پێناویا خوێنیان رژا.
زۆرمان ئازارو مەینەت چەشت ،
هەتاوەکو ئازادکرا.
بەلام ،سەدداخ!! هێندەی نەبرد.
شەڕی ناوخۆ هەلایساو
ئازادیمان وەفاتی کرد.
*ئەم شێعرەلە ئابی 2000ز دا لەبلاوکراوەی بێداری یەکبوونی قوتابیاندا بلاوکراوەتەوە.

## بەرهەمی -کتێبی نووسەر

1- ڕێبەری سایتە کوردییەکان

کەزیاتر لە هەزار سایتی کوردی هەمەڕەنگی لەخۆگرتووە.

2-فۆتۆشۆپ سیئێس

لەدووتوێی 147لاپەڕەدا یەو،هەنووکە لەبازاڕەکانی کوردستاندا دەفرۆشرێت و،لەئایندەیەکی نزیکدا ،دەنێردرێت بۆ ماڵپەرەکانی ئینتەرنێت و،تیایدا بڵاو دەکرێتەوە.

3- فێربوونی بەکار هێنانی تۆڕی ئینتەرنێت.

4-زێڕینە وشە ... وشەی زێڕین

5-ویندۆز ئێکس پی .

6-ئینسایکلۆپیدیای ئینتەرنێت

بەقەبارەی زیاترلە500لاپەرەیa4.

7-لاو ...و ژیانی سێکسی

لێکۆڵینەوەیەکی پزیشکی،کۆمەلأیەتی،گشتیٍیە،لەسەر ژیانی لاو

8-لەریٚ

ناونامەی کوردی

ئەم کتێبە زیاتر لە5هەزار ناوی کوردی ڕەسەن و،جوان لەخۆ دەگرێت.

9-مایکرۆسۆفت ئێکسێس

10-وشەی زێڕین...زێڕینەوشە

ئەم کتێبە وتەو ،پەندی زۆرێك لەبیرمەندان و،کەلە نووسەرران لەخۆدەگرێت و،زیاتر لە 2000وتەی تیادا جێکراوەتەوە.

11-بستێ لەملای بەهەشتەوە،نا...بستێ لەملای دۆزەخەوە.

نامیلکەیەکەو سەرجەمی چیرۆکیکانی نووسەری لەخۆگرتووە.

12-نێتۆرکینگ

13-ڕێبەری سەتەلایت.

14-فرۆنت پەیج

15-ماکرۆمیدیا فلاش میکس

16-لاو ...و قەیرانی بەهاوسەربوون.

17- فۆتۆشۆپسی ئێس 8و9

18-زمانی گوڵ و،تاجی ئەویندارى

سەرجەمی وتارەکانی نووسەر

19-دکتۆرای ئەوین- یەکەم دیوانە شێعری نووسەر



دکتۆرای ئەوین"
تا ئەو ساتەی تۆم نەناسی..
فرەشێتی  ماجستێرو
دکتۆرابووم.
کەچی گوڵم بەناسینت..
لەو حەزەشم تەوەلابووم.
وەلێ،قەینا..
لەنێو زانکۆی چاوەکانتادکتۆرای..
ئەوین ئەخوێنم.
گەر ئیمتیازیش نەهێنم"
دڵنیابە وازناهێنم.
چونکەگوڵم..
باشەی تۆوەك ئیمتیازە.
دکتۆرای ئەوین بێلیژنەو
بێسەرۆکەو
هەمووی ڕازە.
کچە ڕەشتاڵەکەی دڵم..
ئەگەر ڕۆژێك بەکامێرای نیگایەکم
وێنەیەکی جوانت نەگرم
لەخۆم ونم...
چونکە گوڵم تۆ لێم ونی.
چۆن ون نەبم...
تۆ بابەتی ماجستێرو
نامەی دکتۆراکەی منی....